

نووسنی:
د. وصفی محمد علی

# پوختەیەك لە
# پزیشکی دادوەری



وەرگێڕانی:
بهجت صبری ئاکرەیی

# پزیشکی دادوەری


داناني: دکتۆر وەسفی محەمەد عەلی
وەرگێڕانی: بهجت صبری ئاکرەیی



نەخشەسازیی ناوەوە: جمعة صدیق کاکە
چاپی یەکەم ٢٠٢٠
عدد النسخ: ٥٠٠





لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی (تەبایی)
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی پەرتوکی یاسایی.
ژمارەی مۆبایل : ٠٧٥٠٧٠٢٦٠٢١
بەڕێوەبەری ناوەند : ڕەوەند حکیم

# ناوەرۆك



# پێشەكی

زانای گەورە و شكۆدار دكتۆر وصفی محمد علی، لە ساڵی ١٩٦٦ كتێبێكی دانا بەناوی (پزیشكی دادوەری زانست و جێبەجێكاری)، وەك دەرئەنجامی شەونخونی و كارامەیی بۆ پیشەكەی، پزیشكی دادوەری بۆ ماوەی ٣٠ ساڵ، وە بەرهەمی خوێندنی لەسەر دەستی كۆمەڵێك لە گەورە مامۆستایانی ئەو لایەنە زانستیە، ئەو كتێبە بەرهەمی زانیاریی زانستی تیۆریی تێكەڵاو بە شارەزایی پراكتیكی بووە، لە ئەنجامی كاری مەیدانیی بەردەوام بەدرێژایی سێ دەیە و بەدواداچوونەكانی خودی دانەر بۆ رووداوە جۆربەجۆرەكانی ئەم لقەی پزیشكی، چ لە پەیمانگەی پزیشكی دادوەری لە بەغدا بێت، كە ڕاستەوخۆ شارەزایانە و پیشەییانە بەڕێوەی دەبرد، كە وێنەی كەم بووە، یان لە پەیمانگە پزیشكییە دادوەریەكانی تر (عەرەبی و بیانی) لە چەندین وڵاتی ئەوروپا و ئەمەریكا .

ئەو كتێبە بە پێشوازییەكی گەورەی لێكراو گرنگیەكی بێ وێنەی پێدرا، نەك هەر پزیشكە دادوەرییەكان، بەڵكو سەرجەم پزیشكان و قوتابیانی پەیمانگە پزیشكیەكان و كۆلیژەكانی پۆلیسی و یاسا و ئامادەیەكانی پۆلیسی لەئامێزیان

گرت، ئەمەش وایكرد چەند جار لە چاپ بدرێتەوە ، دانەر هەموو چاپێكی نوێی پاكنووس دەكرد و تازەداهاتوەكانی بابەتەكەی بۆ زیاد دەكرد و، كورتەی ڕوداوە ناوازەكانی تۆمار دەكرد، لەوانەی لە پەیمانگەی پزیشكی دادوەریی لە پارێزگاكان چارەسەر كراون، لەگەڵ دوایین داهاتووەكانی ئەو زانستە گرنگە لە جیهان، تا ببێتە سەرچاوەی چاكترین سەرچاوە بۆ لێكۆلەرەوان و بەدواداچوونەكان و ئەوانەی گرنگی بە بابەتی پزیشكی دادوەری دەدەن.

مامۆستا پایەدارمان بەپێویستی زانی ئەم كتێبە پوختە دابنێ و، هەوڵی داوە كورتی بكاتەوە بەشێوەیەك لەبەهاكەی كەم نەكاتەوە، بنەماكانی پزیشكی دادوەری لەخۆ بگرێت، تا خوێنەرانی بابەتەكە ماندوونەكات لە خوێندنەوەی سەرەتاییدا، وەك قوتابیانی یاساو ئامادەییەكانی پۆلیسی، بەڵكو قوتابیانی هەردوو كۆلیژی پزیشكی و پۆلیسیش، ئەوەبوو ئەم كورتكراوەیە بەدەستهات، گشت بنچینەكانی پزیشكی دادوەری تێدایە، لەگەڵ باسكردنی بێ قووڵ بوونەوەی زیانەكانی جۆرەها ئامێر و رووكاری برینەكان و ژەهراوی بوونەكان، لەلایەكی ترەوە شێوازە جۆراوجۆرەكانی ناردنی تووشبوان و مردووان بۆ پزیشكی دادوەری و، مادە (دەستبەسەرداگیراوەكان) بۆ لایەنی تایبەت بۆ پشكنینی تاقیگەیی ڕوندەكاتەوە، هەروەها ئەو ڕونكردنەوانەی لێكۆڵەر دەتوانێت لە پزیشكی داوابكات، بەمەبەستی رۆشنكردنەوەی ڕێگاكانی لێكۆڵینەوە، بەجۆرێك ئەو كەسەی ئەم كتێبە دەخوێنێتەوە، خۆی لە هەڵەكان بپارێزێت و لە بەلاڕێداچوون بەدوور بێت و، لە ئەنجامدا بتوانێت ئەركەكەی بە چاكترین شێوە

بەڕێوە ببات.

چاپی یەکەمی ئەم کورتکراوەیە ساڵی ١٣٩٤ ك. ١٩٧٤ز. دەرچوو، ساڵی ١٣٩٦ك، ١٩٧٩ ز. چاپی دووەمی پاکنوسکراوی بڵاوکرا، چاپکردنەوەی ئەم کتێبە چەند جار دووبارە بووەوە، دانەریش لەگەڵ هەر چاپێکی نوێدا، بە کۆششێکی ناوازەی پیرۆزەوە، پاکنوسیی بۆ دەکرد و تازەداهاتوەکانی بۆ زیاد دەکرد و هەندێك لە هەڵەکانی راست دەکردەوە، لە دوایین چاپیدا (کە چاپی چوارەمە) دەڵێت: ((هەموو توانای خۆم خستەکار و سوپاسی خودای بێ هاوتام کرد لەسەر سازاندنی کارەکانم، داوام کرد وابکات زانست و کارەکانم بە پوختی بۆ ئەو بێت و، هاوکارم بێت تاکو دانەر هەردەم جێ متمانە بێت و زانیاریمان زیاد بکات، تا بەردەوام بم لە دەرچواندنی هەرچی بەسوودە بۆ ئەوانەی ژیانیان تەرخانکردووە بۆ شکست پێهێنانی ناهەق و خۆیان بەخت دەکەن بۆ ڕوبەڕووبوونەوەی خراپکاران و لابردنی پەردەی تاوانەکانیان، تا بە خوێندنەوەی ناوەرۆکی ئەم کتێبە، ئاگاداری ڕوکاری تاوانکاریی جۆرەها ئامێری تاوانکاری بێت و، دوای پشکنینی وردی زیانەکان، بتوانێت جۆری ئامێری بەکارهاتوو دیاریی بکات و، لەکاتی پشکنینی شوێنی تاوانەکە بتوانێت شوێنەوارەکان بخوێنێتەوە، بۆ گەیشتن بە ئاشکراکردنی شاراوەکانی کارە دەستدرێژکارییەکان. بەخوا ئەوە کارێکی ڕێزدارە، هاوکارە بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگەیەکی نموونەیی و بەشدارە لە دەستبەسەرداگرتنی دەرون نزمە دڕندەکان، خوداش هاوکار و پشتیوانمە، هیوادارم ئەم کتێبە جێ متمانەی ئەوانە

بێت کە دەیخوێننەوە)).

ئەم چاپی چوارەمەی دوایین، چەند جار دووبارە کرایەوە، تا وای لێهات پیتەکانی گونجاو نەبن و نەخوێنرێنەوە. بۆیە کۆمپانیای (عاتك) بۆ بەرهەمهێنانی کتێبی بنچینەیی، پێی باش بوو چاپەکەی پاکنووس بکاتەوەو دووبارە ڕێزبەندی پیتەکانی چاککردەوە، بەشێوەیەك شایستەبێت بە کتێبەکە و دانەرە پایەدارەکەی، ئەوەبوو ئەم چاپی پێنجەمە هاتە بەرهەم، وەك ڕێزلێنانێك لە کتێبەکەو خاوەنەکەی، کە تەمەنی خۆی لە خزمەتی زانست و کاردا بەسەر برد، کە بەراستی شایستەبێت بە پایەی زانایان و کتێبەکەی چاکترین نموونە بێت لەسەر زانستی بەسوود، پێغەمبەرمان (درودی خوای لەسەربێت) فەرموویەتی: (ئەگەر نەوەی ئادەم مرد، کاری دەپچڕێ، تەنها لە سێ شت نەبێ: چاکەیەکی بەردەوام، یان زانستێك سودی هەبێ، یان منداڵێکی چاکەکار دوعای بۆ بکات).

ئەو زانستەی کەمرۆڤ پاش مردنی سودی لێ دەبینێ، ئەو کتێب یان زانستەیە، کە لەپاش خۆی بەجێی هێشتبێ بۆ کەسانی دیکەو، خەڵك سوود لەو کتێبە وەربگرن، یان زانستخوازان فێری بن و فێری کەسانی دیکەی بکەن، کەواتە پیرۆز بێت لە مامۆستامان دکتۆر وصفی محمد علی، لە بەردەوامیی کارەکەی بەبێ پچڕان، خودا هەمو پاداشێکی خێر و چاکی پێ بدات.

کۆمپانیایی عاتك

سەرپەرشتیاری گشتی

# پێشەكی وەرگێر

ئەم پەرتووكەی كەلەبەر دەستمان دایە گرینگی تایبەتی خۆی هەیە لەبواری لێكۆلینەوەو بەڵگەی تاوانی لە ڕووی پزیشكی یەوە، چونكە ئاسانكاری و چارەسەری باشمان بۆ دەكات بۆ دۆزینەوەی تاوانبار و زانینی چۆنیەتی تاوان كردن .

بەباشم زانی ئەم پەرتووكە لەزمانی عەرەبی یەوە وەربگێرم بۆ زمانی شیرینی كوردی تا سەرچاوەیەكی دیكە لە پەرتوكخانەی یاسایی زیاد بێت وەك ئاسانكارییەك بۆ قوتابی و خوێندكارە خۆشەویستەكانمان لە قۆناغی خوێندنیان لە كۆلێژی پزیشكی و كۆلێژی یاسا و كۆلێژی پۆلیس بە سوود وەرگرتن لەم زانستە بەزمانی كوردی، چونكە ئەم پەرتووكە پەرتوكێكی زۆر چاك و گرینگە بۆ زانستی پزیشكی دادوەری وە دانەری ئەم پەرتووكە بەڕێز دكتور وصفی محمد علی خوا لێیخۆش بیت زۆر بە پوختی و ئاسانكاری و بە كورتی باسی پزیشكی دادوەری كردووە لەگشت بوارەكانی ڕووداوەكانی كەلە ژیانماندا ڕوودەدەن و یاخود پێشووتر ڕوویانداوە وە هەروەها بۆ زیاتر ڕوونكردنەوەی بابەتەكان نموونەی زۆر جوان و پوختی هێناوەتەوە.

وەلەبەر باشی و پوختی ناوەڕۆكی ئەم پەرتووكە چەندین جار لەچاپ دراوەتەوە چونكە داواكارییەكی زۆری لەسەر بووە وە دووایین جار كۆمپانیای عاتك ئەركی لەچاپ كردنی پێنجەمی خستە ئەستۆی خۆی وەك ڕێزلێنانەك بۆ

دانەری بەڕێزمان وەهەروەها منیش بە پێویستم زانی کە وەری بگێڕم بۆ سەر زمانی شیرینی کوردی.

وەسوپاسی پەرتوکخانەی تەبایی دەکەم کە هاندەرم بوو وە هەروەها سوپاسی خیزانەکەم و کوڕو کچە شیرینەکەم دەکەم هەریەك لە دکتور مصطفی و دکتۆرە مروە کە یارمەتییەکی زۆریان دام لە زاراوە پزیشکییەکان. وە هەروەها مامۆستا ادریس احمد کە یارمەتییەکی زۆری دام وە هەروەها سوپاسی هەموو لایەك دەکەم کەیارمەتی و ئاسانکاریان بۆ کردم.

لەکۆتاییدا هیوادارم کارێکی بەسوودم بەخشیبێت بۆ خزمەتی ڕەوتی زانست لە هەرێمی کوردستانی خۆشەویستمان و بەداوای لێبووردنەوە لە بوونی هەر کەم و کوڕیەك.

وەرگێر



# بەشی یەکەم
# کۆمەڵە دادوەرییە پزیشکییەکان

## تەوەرەی یەکەم
## پزیشکی دادوەری (شەرعی) یاسایی

لقێکە لە پزیشکی تایبەت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان لە ڕوانگەی پسپۆرانی یاساناسان لەڕووی پزیشکییەوە.

پزیشکی دادوەری تایبەتە بە چارەسەرکردنی ئەو کێشانە و لێکۆڵینەوەیان و دەربڕینی ڕا لەبارەیانەوە، بەر لە باسکردنی لێکۆلینەوەی پزیشکی دادوەری، واباشە ئەو ڕێوشوێنانە بخەمە ڕوو، کە ئەندامانی دادگا و لێکۆڵینەوە دەیگرنەبەر، کاتێك ڕوداوەکان دەخرێنە بەردەست پزیشك، بۆ ئاسانکردنی بابەتەکە، پۆلێنم کرد بۆ چوار کۆمەڵە، هەر کۆمەڵەیەك چەندین حاڵەتی جیاواز لە چۆنیەتی و هاوشێوە لە خستنەڕوو لەخۆ دەگرێت.

## ١- کۆمەڵەی زیندووەکان:

ئەمانە دەگرێتەوە :

أ. تووش بوونیان بە بڕینی جۆراوجۆر بە ئامێری (تیژ - بڕەڕ - شکێنەر- شکێنەری بڕەڕ - کونکەر - ئاگرین).

ب.سوتان بەهەموو جۆرەکانیەوە، چ لە ئەنجامی گەرمای ووشك دروست بوویێت، وەك (گڕی ئاگر – کانزای سورەوەکراو- داخکرن - تەزووی کارەبا)، یان بە هۆکاری گەرمای شێدار وەك سووتانەکانی کوڵان- پێداڕژانی (شلە گەرمەکان و هەڵمەکەی)، هەروەها سووتانە کیمیاوییەکان، کە بەهۆی ماددە سوتێنەرەکانەوە، ترشیەکان بێت یان تفتی.

ج. ژەهراوی بوون بە گشت جۆرەکانییەوە: (بەکتریایی- کیمیاوی- خودی).

د . ڕوداوی بەرکەوتنی بەئامانجگیران و هەستیاری (کە بەمردن کۆتا نایەت).

هـ . تاوانە سێکسییەکان (دەستدرێژی- زینا-نێربازی(لواطة-Sodomy) و، ئەو نەخۆشییە گوێزراوانەی کە لەمانەوە پەیدا دەبن.

و . باری دووگیانی(زگپڕی) نارەوا و، ئەوەی هاوپێچیەتی لە ڕوودانی ناکۆکی لەسەر باوکایەتی، وەك ئەوەی ئافرەتێك بڵێت دووگیانە لەکەسێك و، کەسەکەش نکۆڵی بکات، هەروەها تێکەڵ بوونی مناڵە

لەدایکبووەکان لە نەخۆشخانەی لەدایکبوون، یان ڕفاندنیان و، دروستبوونی جیاوازی لە سەر باوانی.

ز. تاوانی لەباربردن .

ح. خەملاّندنی تەمەن .

ط . خەملاّندنی پەککەوتەیی – بێ توانایی، مەبەست لێی ئەوەیە ئەندامی تووشبوو ناتوانێت ئەرکەکەی ئەنجام بدات، بەشەکی بێت یان گشتی، هەمیشەیی بێت یان کاتی.

ی . حاڵەتی شێوان- شێواندن - بریتییە لە گۆڕانێکی ڕووکاری لە شوێنێك لە شوێنەکانی لەش دووای تووشبوونی.

**ئاگادارکردنەوە :** لە تەوەرەی ڕونکردنە تایبەتەکان بە برینەکاندا باس لە بابەتی پەککەوتن و شێواندن دەکەین .

**شێوازی ناردن بۆ پشکنینی پزیشکی :**

بۆ ناردنی ڕووداوە پزیشکییە دادوەرییەکانی تایبەت بە زینـدووان ڕێڕەوێکـی گونجاو هەیە، پێویستە بەووردی بگیرێتەبەر، بۆ ئەوەی بوار نەدرێت کەلێنێك لە زنجیرەکە دروست بێت، کە لە ساتی ناردنی لێکۆڵەرەوە دەست پێ دەکـات، بـۆ ئەو کەسەی دەویسترێت پشکنینی بۆ بکرێت، هەتا وەرگرتنی لە لایەن پزیشـك بە مەبەستی پشکنین.

ئەمانەی خوارەوە باسێکی ئەو شێوازەیە:

١. نووسراوێك ڕێك دەخرێت و، لێکۆلەر واژووی لەسەر دەکات، کە پوختەی بارودۆخی ڕووداوەکە لەخۆدەگرێت و، ناوی تەواوی کەسە نێردراوەکەی لەسەر بێت، لە پاشکۆکەیدا پرسیاری ڕونکردنەوەیی دەکات کە لێکۆلەر بەپێویستی دەزانێت ئاراستەی پزیشك بکرێت .

٢. پۆلیسێك هاوەڵی نێردراوەکە دەبێت، نووسینی ژمارە و ناوەکەی لەسەر نوسراوی داوای پشکنینەکە تۆمار دەکرێت.

٣. وێنەیەکی نوێی فۆتۆگرافیی کەسە نێردراوەکە لە گۆشەیەکی نووسراوەکە دەدرێت، پاشان بەمۆری لێکۆڵەرەوە مۆر دەکرێت، وە سێ وێنەی زیادە لەگەڵ نوسراوی داوای پشکنینەکە دەنێردرێت، کە لەلایەن لێکۆڵەر ڕێکخراوە، تا هەر یەکێك لە دوو وێنەی ڕاپۆرتی پزیشکییەکە وێنەیەکی پێوە بلکێنرێت، بۆ جێ بەجێ کردنی بڕیاری داواکاری گشتی لە عێراقدا، کە بە نووسراوی ژمارە م ع ٢٣ /٦٣/١١/ ١١٠٤ لە بەرواری ٢٤-٤-٢٠١٤ زایینی بە وەزارەتی تەندروستی ڕاگەیەندراوە، تیایدا بە پێویستی دادەنێت، کە هەر ڕاپۆرتێکی پزیشکی دادوەری، کە پزیشك دەری دەکات، دوو وێنەی لێ بدرێت بە لێکۆڵەر، تا بتوانرێت یەکیان لەگەڵ فایلی یەکەمی کێشەکە دابنرێت، دووەمیان لە هەڵگیراوێکی تری تایبەت بەهەمان کێشە دابنرێت، بۆ ئەوەی نوێنەری داواکاری گشتی بتوانێت لەکاتی پێویست بۆی بگەڕێتەوە، وەزارەتی تەندروستیش لایەنگیریی ئەو

بڕیارەی کرد و نووسراوێکی دەرکرد بە ژمارە ١٩٨٢٤ بەرواری ٧-٧-١٩٦٣، بۆ جێبەجێ کردنی لەلایەن پزیشکانەوە. وێنەی سێیەمیش دەلکێنرێت بەو ڕاپۆرتە پزیشکییەی هەڵگیراوە لەو دامەزراوە تەندروستیەی ڕاپۆرتەکەی ڕێکخستووە.

٤. مەچەکێکی ئەو کەسەی ئەو کەسەی دەویسترێت پشکنینی بۆ بکرێت، بە مۆری لێکۆڵەر مۆر دەکرێت.

٥. لە نووسراوەکەی داوای پشکنین ئاماژە بەو ڕێوشوێنەی سەرەوە دەکرێت.

**ئاگادارکردنەوە** ، ئەگەر بەرکەوتنەکە مەترسیدار بوو، بەجۆرێك هەر دواخستنێکی ناردنی بەرکەوتووەکە بۆ پشکنین و چارەسەر، زیان بەتەندروستیی بگەیەنێت، لەو کاتەدا پێویستە پابەندی ئەو شێوازە نەبێت و، دەبێ لێکۆڵەر هاوەڵی بەرکەوتوو بێت، یان یەکێك لە پۆلیسەکان راسپێرێت هاوەڵیی بکات، لەلایەکی ترەوە پێویستە پزیشك ڕاستەوخۆ بەفریای بەرکەوتووەکەوە بچێت، بەبێ پابەندبوون بەو شێوازەوە، وەك جێبەجێ کردنی ئەوانەی کە لە ڕێنماییەکانی پزیشکی دادوەریدا هاتووە[1].

بەڵام لەو حاڵەتانەی کەلێکۆڵەر بڕوای وایە کە بۆ لێکۆڵینەوەکە گرنگ نییە، وەك ئەوەی کاتی بێت، تەنها نووسراوەکەی باسکراوە بەدەستی یەکێك لە پۆلیسەکان دەنێرێت بە هاوەڵیی بەرکەوتووەکە بۆ دامەزراوەی تەندروستی

---

[1] ڕێنماییەکانی پزیشکی دادوەری لە ژمارە ٢٢٤٠ لە (وقائع العراقية)ی دەرچوو لە ٢٣ نیسانی ١٩٧٣ بڵاوکراوەتەوە.

فەرمی دەنێردرێت، یان مۆر لە مەچەکی دەدرێت و نوسراوی داوای پشکنین دەدرێتە خۆی، یان ئەوەی لە گەڵیەتی، بە گوێرەی ئەوەی کە لێکۆڵەرەوەکە پێی گونجاوە.

**ڕەتکردنەوەی پشکنین :**

لەوانەیە کەسی نێردراو بۆ پشکنینی پزیشکیی دادوەری، ڕەتی بکاتەوە، وەك هەندێك جار لە ڕووداوی تاوانە سێکسییەکان و لەباربردن ڕوودەدات، پێویستە پزیشك بزانێت ئەو مافەی نییە ناچاری بکات، لەسەریەتی ڕەتکردنەوەکە تۆمار بکات و یەکسەر بە تەلەفۆن یان بەزووترین کات، ئەو لایەنە فەرمییە ئاگادار بکاتەوە، کە داوای پشکنینەکەی کردووە، بە جێگیرکردنی ڕەتکردنەوەکە بەنووسراوێکی تایبەت و بنێردرێ بۆ ئەو لایەنە.

**٢. کۆمەڵەی مردووەکان :**

حاڵەتەکانی مردنی جێگومان دەگرێتەوە، مەبەست لێی هەر مردنێکە، بارودۆخی ڕوودانی وا پێویست دەکات دەسەڵاتی لێکۆڵینەوە بێتە ناویەوە، بەمەبەستی دڵنیابوون لە سروشتی مردنەکە و بەهۆی ڕووداوێکی تاوانکارییەوە نەبوو‌بێت. ئەو جۆرە مردنە تاکە سەرچاوەیە بۆ ڕووداوەکانی توێکاری پزیشکی دادوەری .

ڕووداوەکانی مردنی گومانلێکراو، ئەگەریش لەڕووی ڕەنسیبەوە، هەموو ڕووداوێکی مردن دەگرێتەوە، پێویستە لەسەر لێکۆڵەر بەحوکمی پیشەکەی، دەبێ لێکۆڵینەوە لە هەموو کارێك بکات، کە تاوانکاری بێت یان گومانی

تاوانکاری لێبکرێت، لەبەر بوونی گومانێك کە وادەگەیێنێت مردنەکە بەهۆی کارێك بووە کە بەیاسا سزای لەسەر دەدرێت، لێکۆڵینەوەی تێدا دەکات، جا هەرچەندە گومانەکە لاواز بێت، لەبەر ئەستەمیی نووسینەوەی یەك بەیەکی ئەو رووداوانە، وەك ئاسانکاریەك بۆ لێکۆڵەر، بەڕێژەیی کراوەو هاوشێوەکان کۆکراونەتەوەو پۆلێن کراون، بەو پێیە ڕوداوەکانی مردنی گومان لێکراو ئەمانە دەگرێتەوە :

أ. بەرکەوتووەکانی برینی – بەجیاوازی جۆرەکانی – کە بەمردن کۆتاییان دێت.

ب. بەرکەوتووەکانی سووتان - بەجیاوازی جۆرەکانی – کە بەمردن کۆتاییان دێت .

ج. تەرمی دۆزراوە لە شوێنە گشتیەکان (مزگەوت - قوتابخانە - باخچەی گشتی - شەقام) یان تایبەت (خانووی ماڵان - نووسینگەی خاوەن پیشەکان) بەبێ زانینی هیچ لە بارودۆخی مردنەکە، وەك مردنی کەسێك کە بەتەنها لە خانوویەکدا دەژی، دراوهاوسێکەی بەهۆی بۆنی شیبوونەوەی لاشەکەی هەستی بە مردنی کردووە، یان لە کاتی مردنیدا یەك کەسێکی خزمەتکاری لەگەڵدا بوویێت، وا گومان دەکرێ بەمەبەستێك دەستدرێژیی کردۆتە سەری و مراندوویەتی.

د. خنكان بەهەموو جۆرەكانی ((هەڵواسین- خنكاندن بە ملپێچ یان بەدەست ....هتد).

ئاگاداركردنەوە : ڕووداوی مردنی حوكم دراو بە سێدارە بەهەڵواسین یان بە گولـلەبارانكردن، بەحاڵەتی مردنی گومانلێكراو دانانرێت، لەبەر نەبوونی هیچ گومان تێیدا، چونكە هۆی مردنەكە ڕوون و ئاشكرایە، لە تۆماری بڕوانامەی مردندا تۆماردەكرێت، كە ئەو پزیشك ئامادەی لەسێدارەدانەكە بووە ڕێكی دەخات، وەك جێبەجێكردنی یاسای تۆماركردنی لەدایكبوون و مردنەكان، ژمارە ١٤٨ سالی ١٩٧١ زایینی .

هـ . خۆكوشتن بەهۆكارە جۆراوجۆرەكان .

و . ڕووداوی نقوم بوون لە ڕووكاردا: وەك دیتنەوەی تەرمێك لە جۆگەلەیەك یان زۆنگاوێگ یان بیرێگ یان ڕووبارێك، ئەو حاڵەتانە لای ئێمە پێی دەگوترێت -ڕووداوی- ڕوودانی نقووم بوون-، بەپێی ڕوكاری حاڵەتەكە، لە چەندین حاڵەتدا پشكنینی پزیشكی دەری خستووە، ئەو كەسەی تەرمەكەی لە ئاو دەرهێنراوە، بە نقوم بوون نەمردووە، بەڵكو كوژراوە یان خنكێنراوە یان ژەهرخواردوو كراوە، پاشان تەرمەكەی فڕێ دراوەتە ناو ئاوەكە، بۆ شاردنەوەی ڕاستییەكان .

ر . حاڵەتە جۆراوجۆرەكانی ژەهراوی بوون، كە كۆتاییان بەمردن هاتووە .

ح . مردنی لەناكاو: مردنی چاوەڕوان نەكراو، لە كەسێك كە لەڕووكاردا تەندروستیەكی باشی هەیە.

ط . ڕووداوەکانی لیدانی بەئامانج: مردنی خێرا لە ئەنجامی لێدانی دژە زیندەکیەکانی وەك پەنسلین و کۆتاییهاتنی بەمردن.

ی . تەرمی تازە لەدایك بووان، کە بارودۆخی مردنەکەی یان بوونی لە شوێنێکی گشتی، وادەخوازێت دەسەڵاتی لێکۆڵینەوە لێی بکۆڵێتەوە.

**چۆنیەتی ناردنی تەرم بۆ پشکنینی پزیشکی :**

ناردنی تەرمی کەسی گومانکراو لە مردنەکەی، بۆ لای پزیشك، بەمەبەستی توێکاری، ڕێکارێکی تایبەتە بەئامانجی ڕێگرتن لە هەر دەستکارییەك، کە زیان بە لێکۆڵینەوە بگەیەنێت. بۆ بەدەستهێنانی ئەم ئامانجە پێویستە لەسەر لێکۆڵەرەوە پابەند بێت بەو ڕێکارەی لە خوارەوە ئاماژەی بۆ دەکەین:

١ . لێکۆڵەر لە کاتی پشکنینی تەرمەکەدا، بەدوای ئەو خاڵانەدا دەگەڕێت کە پێویستی پێیەتی، بەمەبەستی ڕێکخستنی لیستی داوای توێکاری، - واباشترە لە کاغەزێکی تایبەت تۆماری بکات و پشت بەیادەوەریی خۆی نەبەستێت-، لەوانە سیفەتە جیاکەرەوەکانی ناسنامەی کۆچکردوو و، وەسفی یەك یەکەو ڕوکاری ئەو جلوبەرگانەی لەسەر تەرمەکە هەن و، تۆمارکردنی ئەو دڕاوی و ماددە نامۆیانەی لەسەریەتی، پاشان تێبینی کردنی ئەو زیانانەی لەسەر تەرمەکە هەن، هەر جۆرێك بێت، دیاریی کردنی ژمارەو شوێنەکەی و خەمڵاندنی فراوانیەکەی، بەمەبەستی پڕکردنەوەی خانە بەتاڵەکانی لیستەکە .

٢. بۆشاییەکانی لیستی داواکاریی توێکاریی مردوو پڕدەکرێتەوە، کە لیستێکی چاپکراوەو لە دوو لاپەڕەی جیا پێك هاتووە، هەر لاپەڕەیەك کۆمەڵێك خانەی بەتاڵی تێدایە، لەلایەن لێکۆڵەری بەرپرس، بەزانیاریی داواکراو پڕ دەکرێتەوە، لاپەڕەی یەکەمی لیستەکە پڕدەکرێتەوە، تا لەگەڵ هەموو پەیوەستەکانی مردنە گومانلێکراوەکە بنێردرێت، بەڵام لە رووداوی ژەهراویبووندا، لاپەڕەی دووەم لەگەڵ یەکەم، پاش پڕکردنەوەی خانە بەتاڵەکانی، بەزووترین کات لە گەڵ تەرمەکە دەنێردرێت، یان دواتر.

لە پەراوێزی لیستی داوای توێکاری بەهەردوو لاپەرەکەیەوە، لە شوێنی تەرخانکراو، واژووی لێکۆڵەر و پرسیارە ڕوونکەرەوەییەکان تۆمار دەکرێن، ئەوانەی لێکۆڵەر بە پێویستی دەزانێت ئاراستەی پزیشکی پشکنەری بکات، دەبێ بە سێ نوسخە بنێردرێت، تا پزیشك یان جێگرەکەی لە خوارەوە واچووی لەسەر بکات و کات و بەرواری وەرگرتنەکە تۆمار بکات، دەبێ ئەوەش بزانین کە بەڕێوەبەرایەتی پەیمانگەی پزیشکی دادوەری لە بەغداد ئەم لیستەی ئامادەکردووە، بە ڕەزامەندی سەرۆکایەتی داواکاری گشتی، بە نووسراوی ژمارە ١٦٩٥ لە بەرواری ٢٧- ٥- ١٩٧٠، هەروەها داوا دەکات نوسخەی پێویست بدرێت بە لێکۆڵەرەوان.

تەرمی تازەلەدایکبووان لە حاڵەتەکانی لەباربردن و لەدایکبوونی پێش وەختە، کە دەتوانرێ بەڕووکاری بزانرێت کە ئادەمیزادە، دەنێردرێت بۆ

پزیشك، بە هاوپێچی لیستی داوای توێکاری، بەڵام ئەگەر کۆرپەلەی لەباربراو، بارستەیەکی تەونی بوو، نەدەکرا جۆرەکەی دیاریی بکرێت، ئەمە لە حاڵەتی سێ مانگی یەکەم لە سووڕی سکپڕی، ئەوسا دەنێردرێت بۆ پشکنین بە گوێرەی رێکارەکانی کۆمەڵەی پشکنینە تاقیگەییەکان.

٣. لەڕێگای ئەو پۆلیسەی لەگەڵ تەرمەکەدا دەڕوات، لیستی داوای توێکاری بۆ پزیشك دەنێردرێت، ژمارە و ناوەکەی لە لیستەکە لە شوێنی تایبەت تۆمار دەکرێت، نوسخەیەکی لەلایەن پزیشك یان جێگرەکەی دەپارێزریت و دوو نوسخە دەگەڕێنرێتەوە بۆ لێکۆڵەر، بەدەستی پۆلیسەکەی هاوەڵی تەرمەکە، پاش تۆمارکردنی ئەوانەی باسکران، تا ببێتە بەڵگەنامەیەکی فەرمی وەرگرتنی تەرمەکە بسەلمێنێ.

٤.کاغەزی ناسنامە : کاغەزێکی لە مەقەبا بە دەزوویەك لە مەچەکی تەرمەکە دەبەسترێت، تیایدا ژمارە و بەرواری لیستی داوای توێکاری و، ناوی مردوو و، ئەو بنکەی پۆلیسەی تەرمەکەی ناردووە، لە خوارەوەی لێکۆڵەر ئیمزای دەکات، لەسەر پزیشك پێویستە پیش دەست پێکردنی توێکاری، دڵنیابێت لە لێکچوونی زانیاریەکانی سەر کاغەزی ناسنامەکە لەگەڵ لیستی داواکاری توێکاری.

**پشکنینی تەرمە لە گۆڕنراوەکان :**

پرۆسەی کردنەوەی گۆڕ، لەسەر داواکاریی سەرچاوەیەکی دادگایی و بە ئامادەبوونی خۆی یان نوێنەرێکی لە لێکۆڵەرە پسپۆڕەکان دەبێت، پاش

دەرهێنانی تەرمەکە لە گۆڕ و جێگیرکردنی ناسنامەکەی لەلایەن لێکۆڵەرەوە، پزیشك لە گۆڕستان پشکنینی بۆ دەکات، بۆی هەیە داوای گواستنەوەی بۆ دامەزراوەیەکی تەندروستی بکات، ئەگەر پێی باش بوو. لە رووداوەکانی گومان بە ژەهراوی بوون، پزیشك چەند نموونەیەك لە ناو گەدەی مردوو وەردەگرێت، یان برِێك کێشی کەمتر نەبیت لە کیلۆگرامێك، لە ناو هەناوە شیبوەوەکە، لە حاڵەتی هەڵوەشانەوەی پێشەکەوتوودا، کە ناتوانریت ناوگەدەکە جیابکرێتەوە، هەروەها چەند نموونەیەك لە خۆڵی نزیك شوێنی ناشتنەکە وەردەگیرێت، کە لەبەر چاو وادیارە کە پیس نەبووە بە شیبووەوەی شانەکانی تەرمەکە، هەر نموونەیەك کەمتر نەبێ لە یەك کیلۆگرام، لە دەفری تایبەت بە پشکنینی تاقیگەیی خۆڵ، بۆ گەڕان بە دوای ئەو ژەهرانەی لەوانەیە تێیدابێت، بەشێوەیەکی سروشتی یان پاش شیبوونەوەی شانەکان لەگەڵی تێکەڵ بووە.

ئەمەی خوارەوە وێنەیەکە لە لیستی داوای توێکاری بەهەردوو لاپەرەکەیەوە:

## کۆماری عێراق

سەرچاوەی لێکۆڵینەوەیی .................. ژمارە /

بەروار / / ١٩

## لستی داوای توێکاری

بۆ............

تکایە توێکاریی پزیشکیی دادوەری ئەنجام بدەن لەسەر ئەو تەرمـەی لەگـەڵ ئەم لیستەدا نێردراوە، بە هاوەڵیی پۆلیسی ژمارە ............ بۆ ڕوونکردنـەوەی هۆی مردن و وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی لە خوارەوە هاتووە:

ناو و نازناو: ناوی باوك و باپیر:

ناوی دایك و باپیر: ڕەگەز ڕەگەزنامە

ئاین پیشە پێکهاتە ( قەڵەو، ناوەند، لاواز)

ڕەنگی پێست ڕەنگی قژ ڕەنگی مووی ڕوو

چاوەکان رووکاری تەمەن تایبەتمەندی جیاکەرەوەی تر

(شوێنی برین، خاڵ ، کوتان.. هتد ) درێژی ( درێژ، ناوەند، کورت)

بەروارو کاتی بەرکەوتن بەروارو کاتی مردن شوێنی مردن

ئەمانەی لە ناسنامەکەی وەردەگیرێت :

ژمارەی تۆماری شارستانی ژمارەی لاپەرە

پارێزگا قەزا شارۆچکە

**بارودۆخی مردن :** (لێکۆڵەر پوختەی چۆنیەتی ڕووداوی ڕووداوەکە و ئەوەی پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە مردنەکەوە هەیە باس دەکات، وەك وەسفی کەوتنی تەرمەکە و ڕوونکردنەوەی جۆری چەکی بەکارهاتوو و باسی دووری نزیکەیی لە بەرکەوتنی گوللـەدا... هتد).

**شێوەی جل و بەرگ :** (یەك بەیەکی جل و بەرگی سەر تەرمەکە باس دەکات، لەگەڵ ئەو دڕاوی و پیسبوون و مادده نامۆیانەی لەسەریەتی).

**ڕووکاری زیانەکان :** ( باسکردنی ڕووکارو شێوەی زیانەکانی ڕووکاری تەرمەکە و دیاریکردنی ژمارە و شوێنەکەی).

**هۆکاری دیار بۆ مردن لە ڕووی لێکۆڵینەوەییەوە:** ( هۆکارەکە دەنوسێت ئەگەر زانرا، ئەگەرنا دەنوسرێت نادیار).

**پرسیارەکان کە لێکۆڵەر بەگونجاوی دەزانێت بیکات سەرباری داوای هۆی مردن.**

.١

.٢

.٣

.٤ واژۆی ڕێکخەری لستەکە...............

.٥ ناوەکەی ..........

.٦ سیفەتە فەرمانبەرییەکەی .........

واژۆی وەرگری تەرمەکە ناو و سیفەتە فەرمانبەرییەکەی بەروار و کاتی وەرگرتن .

**تێبینی:**

١- لستەکە بە سێ دانە ڕێك دەخرێ، دوانیان دەگەڕێتەوە بەدەستی پۆلیسەکە، پاش پرکردنەوەی بۆشاییەکانی تایبەت بە وەرگرتنی تەرمەکە.

٢. لە ڕووداوی ژهراوی بووندا، لەلایەن داواکاری پشکنینەوە، ئەو زانیاریانەی هەیەتی لە لیستی تایبەتی ئامادەکراو بۆ ئەم مەبەستە تۆمار دەکرێت.

٣. دانانی لیستەکە لە پەیمانگەی پزیشکی دادوەری لە بەغداد، بە ڕەزامەندی سەرۆکایەتی داواکاری گشتی، بەنووسراوی ژمارە ١٦٩٥ لە بەرواری ٢٧- ٥ - ١٩٧٠ و داوا دەکات دانەی پێویست بە لێکۆڵەرەکان بدرێت .

## کۆماری عێراق

### لستی رووداوی گومان کردنی ژەهراوی بوون

سەرچاوەی لێکۆلینەوەیی............ بەروار / / ١٩

ژمارە/................

بۆ........

دوابەدوای لیستی داوای توێکاری بە ژمارە و بەرواری / / ١٩

١ . لای خوارەوە ئەو زانیاریانەی خۆمان تۆمار دەکەین، دەربارەی مردنی ئەو کەسەی ناوی:

- ئەو هۆیانە چین کە گومانی ژەهراوی بوونی دروست کردووە، ئایا گومانی ژەهرێکی تایبەت هەیە؟
- ئایا رووکارە تەندروستییەکانی مردووەکە بەر لە مردنی باش بوو ؟
- دوایین خواردن و خواردنەوە یان چارەسەر (جۆرەکەی بڵێ) کە بەکاری هێناوە چیبوو.
- ئایا کەسانی تر لەگەڵ مردووەکە بەشدار بوون لە دوایین خواردن یان خواردنەوەیدا، ئایا کەسیان تووشی ئەوە بوون کە مردووەکە تووشی بووە؟
- باسی چییەتی نیشانەکانی ژهراوی بوون (خواردنێك لە دەم ، جۆری ئازار، ڕشانەوە، تینوێتی ، سکچوون ).

- ئایا بەشێك لە ڕشانەوە یان لە شوشتنەوەی گەدە یان لە خوێن یان میزی کەسەکە پێش مردنی نێردراوە بە مەبەستی پشکنینی ژەهری ؟
- ئایا ئەو دەفر یان هۆکارانەی تووشبوو پێش مردنی بەکاری هێناوە، شتێك لەوەی خواردوویەتی، نێردراوە بۆ پشکنینی ژەهری؟
- ئایا فریاگوزاری بۆ ژەهراوی بووەکە کراوە ؟

جۆری چارەسەرو دەرمانە بەکارهاتووەکان و دامەزراوە تەندروستیەکە یان پزیشکە چارەسەرکارەکەی فریاکەوتنەکەی بۆ ئەنجام داوە باس دەکرێت.

- بەروار و کاتی خواردنی دوایین خواردن یان خواردنەوە یان چارەسەر .
- بەروار و کاتی ڕوودانی مردن.

رووکارەکانی مردوو لە کاتی پشکنینی و روونکردنەوەی ماوەی نێوان مردن و پشکنینەکە:

٢. هاوپێچ ئەو ماددانەی لە خوارەوە ناویان هاتووە دەنێرین (بەرگ دەکرێت و بە مۆم مۆر دەکرێ و مۆری فەرمیی فەرمانگەی لێدەدرێ) بەمەبەستی گەڕان بۆ ماددەی ژهراوی تێیدا، لەحاڵەتی سەلماندنی بوونی لە تاقیگەدا، گەڕان بەدوا ژەهرەکە لەناو هەناوی مردووەکەدا دەکرێ.

واژۆی ڕێکخەری لیستەکە ..............

ناوەکەی ...........................

سیفەتی فەرمانبەری ..............

تێبینی : پزیشك دوو نوسخە لەم لیستەی پێ دەدرێ لە گەڵ لیستی داوای توێکاری، ئەگەر کرا، یان دواتر لە نزیکترین هەلدا دەنێردرێت، بەمەبەستی ناردنی دانەیەکیان لەگەڵ ناوهەناوەکە بۆ بەڕێوەبەرایەتی پەیمانگەی کیمیاوی لە بەغداد و، پزیشکیش دانەکەی تر دەپارێزێ.

**ئاگادارکردنەوە** : ڕووداوەکانی تایبەت بە زیندووان یان بە مردنی گومانلێکراو، دەنێردرێت بۆ پزیشکی فەرمیی دیاریکراو لەو ناوچەیەی کەوتۆتە ناو فەرمانگە لێکۆڵینەوەی لێکۆڵەرەکە، چ لە ناوەندی پارێزگا بێت وە یان قەزا یان ناحیە .

**٣. کۆمەڵەی پشکنینی تاقیگەیی :**

پێداویستەکانی لێکۆڵینەوە وا لە لێکۆڵەر دەکات پشت بە شارەزایان ببەستێ، سەرباری پزیشکە دادوەرییەکان، ئەرکیان یەکلاکردنەوەی سروشتی پەڵەی بینراو لەسەری لە جل و بەرگ یان جەستەی تاوانباران یان لە شوینی ڕوودانی تاوانەکە یان لەسەر کەلوپەلی تاوان کردنەکە، تا پەیوەندی بە ڕووداوەکە ڕوونبکاتەوە، ناتوانرێت هیچ ڕایەکی یەکلاکەرەوە لەسەر بابەتەکە نادرێت، تەنها پاش ئەنجامدانی پشکنینی تاقیگەیی دیاریکراو، لەبەرئەوە پێم باش بوو ئەو جۆرە پشکنینانە بە کۆمەڵەی پشکنینی تاقیگەیی ناوبنێم، کە ئەمانە دەگرێتە خۆ :

أ- ئەو پەڵانەی کە گومان خوێن بوونیان لێ دەکرێت .

ب- ئەو پەڵانەی کە گومانیان لێ دەکرێت مەنی بن.

ج- پارچە ئەندامییەکان ناتوانرێت سروشتەکەی بەچاو جێگیر بکرێت، وەك پارچە چنراوێکی بچووك بە گۆشت بچێت، لە درزی رووی دەرەوەی چوارچێوە لاستیکیەکەی ئۆتۆمبێل دەبینرێتەوە، گومان بکرێت کە لە جەستەی کەسێك جیابووەتەوە، لە کەوتۆتە بەر ئۆتۆمبێلەکە، یان پارچەیەکی بچووك گومانی لێدەکرێت کۆرپەلەی پێنەگەیشتوو بێت، یان بەشیك لە کۆرپەلە.

د- کۆمەڵە ڕێشاڵێك کە گومانی موو بوونی هەبێت.

هـ-پارچە ئێسکێك گومان بکرێت کە هی کەسێکی ترە .

ئەو مادانەی لە بڕگەکانی أ – هـ دیاریکراوە، دەنێردرێن بۆ بەڕێوەبەرایەتی پەیمانگەی پزیشکی دادوەری لە بەغداد بۆ پشکنین و جێگیرکردنی ئەوەی کە پارچەی مرۆڤییە .

و- ئەو پیسبوونانەی داوا دەکرێ جۆرەکەی جێگیر بکرێ، لەبەر گرنگیەکەی لە رووی لێکۆڵینەوە (باروتی - نەوتی- رۆنی - بۆیەیی).

ز- مادەی جۆراو جۆری پێکهاتە نادیار، لێکۆلەر بەپێویستی دەزانێت دیاریی بکرێت (دەرمان، پاشماوەی خواردن گومانی ژەهراوی بوونی لێ بکرێت، ئەو مادانەی گومانی مادە هۆشبەرەکانی لێدەکرێت (ئەفیۆن یان حەشیش یان کۆکاین یان سەرخۆشکەر وەك کحول یان هی تر).

مادەکانی بڕگەکانی و- ز دەنێردرێت بۆ بەڕێوەبەرایەتی پەیمانگەی تاقیگەی کیمیاوی بەغداد، بێجگە لەو مادانەی کە داوای پشکنینی بۆ

دەکرێت بۆ گەڕان بە دوای پیس بوونی باروتی و دیاریکردنی جۆرەکەی و بەرواری گڕسەندنی، دەنێردرێت بۆ بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی بەدواداگەڕانە هونەرییەکان(تحريات الفنية)- بەغداد.

ح- ئەو نموونانەی وا پزیشك پشکنەر ناچار دەبێت وەری بگرێت لە کاتی چارەسەری ڕوداوێکی پزیشکی دادوەری، بە مەبەستی ئەنجامدانی پشکنینی تاقیگەیی لەسەری (بەکتریایی ، باثولۆجی ، تیشکی، کیمیاوی).

پشکنینەکانی بڕگەی ح دەنێردرێن بۆ پەیمانگا تەندروستییە تایبەتەکان، وەك پەیمانگەی بەکتریۆلۆجی یان باثۆلۆجی یان کیمیاوی یان پەیمانگەی تیشك – بەغداد، بە گوێرەی پشکنینی داواکراو .

**چۆنیەتی ناردن بۆ پشکنینی تاقیگەیی :**

١- ئەو مادانەی گومانی پیس بوونیان لێ دەکرێت بە مادەی خوێن یان مەنی، بە ووشکی دەنێردرێن، تا بەهۆی بۆگەنبوونەوە تێکنەچێت، کە وادەکات پشکنینی تاقیگەیی هەندێك جار زەحمەت یان مەحاڵ بێت.

ماددەی پیس بوو بە خوێن یان مەنی، ئەگەر تەڕ بوو بەجێ دەهێلرێت لە هەوایەکی کراوەدا بۆ ماوەیەکی گونجاو تا ووشك دەبێتەوە، نابێ هیچ هۆکارێکی تری ووشك کردنەوە بەکاربهێنرێت، نادرێتە بەر ئاگر یان ئوتو ناکرێت، وا باشترە زۆر نەدرێتە بەر تیشکی خۆریش.

بەڵام پارچە ئەندامییەکان – پارچەیەکی تۆڕییە، کە گومانی لێ دەکرێ بەشێك بێت لە جەستەی ئادەمیزاد-، لە ناو بوتڵدا دەنێردرێت، باشتر وایە

دژە شکان بێت، باش داخرابێت، تا مادە پارێزەرەکەی بەهەوادا نەچێت، هەروەها مۆر کرابێت، برێکی پێویست لە کهوڵی پوختی تێدایە، بۆ پاراستنی مادەکە لە بۆگەن بوون، بەو مەرجەی پارچەکە هەمووی بەکهول داپۆشرابێت .

٢- باشتر وایە ئەوەی دەویسترێت پشکنینی تاقیگەیی بۆ بکرێت، بەتەواوی بنێردرێت، بەبێ دابڕینی بەشە پیسبووەکەی، ئەگەر ئەوە نەکرا، لەم کاتەدا لێکۆڵەر بڕیار دەدات لەسەر هەڵبژاردنی ڕێگایەك، کە پێی وایە گونجاوە، وەك ڕنینی پەڵە یان هەڵکەندنی بەرد یان بڕینی قژی پیس بوو، یان تواندنەوەی پەڵە بەم ڕێگایانەی خوارەوە:

پارچە شاشێکی بەکارنەهاتوو بەئاوی دڵۆپێنراو تەڕ دەکرێت، پاشان لەسەر پەڵەکە دادەنرێت، بەجۆرێك بەتەواوەتی بەری بکەوێت بۆ چەند خولەکێك، تا داوەکانی بە رەنگی پیس بوونەکە ڕەنگ دەبێت، پاشان پارچە شاشەکە ووشك دەکرێتەوە و بۆ تاقیگە دەنێردرێت .

٣- شوێنی پیس بوو یان ئەوەی دەیەوێت پشکنینی بۆ بکرێت، نابێت بەمەرەکەب یان هەر مادەیەکی بۆیەیی تر چوار دەور بدرێت، بۆ نیشانەکردنی، بەڵکو ئەوەندە بەسە پارچە کاغەزێك لەسەر شوێنی پیس بوونەکە جێگیر بکرێت و لێکۆڵەر ڕوونکردنەوەکانی خۆی لەسەر دەنووسێ بۆ پشکنەری تاقیگەیی .

٤- مادده نێردراوەکان بە بەرگی کاغەزی یان جگە لە کاغەز، بەگوێرەی ئەوەی لێکۆلەر پێی گونجاوە، بەتەواوی بەرگ دەکرێت، بەجۆرێك کە نەتوانرێت دەست لە هیچ بەشێك لەبەشەکانی ماددەکە بدرێت، پاشان بە داوێك دەبەسترێتەوە و بەمۆم مۆری فەرمی فەرمانگەکەی لێدەدرێت لە چەند لایەکەوە بەپێی پێویست، بۆ ئەوەی لێکۆڵەر دڵنیابێت کە هەر هەوڵێکی دەستکاری دەبێتە هۆی شکانی هەندێك لە مۆرەکان یان هەمووی.

٥- کاغەزێك لەڕووی دەرەوەی بەرگەکە دەنوسێنرێت، تیایدا ناونیشانی ئەو لایەنە فەرمیە دەنووسرێت، کە مادەکەی بۆ دەنێردرێت و، تیایدا سەرچاوە لێکۆڵینەوەییەکە و بەروارو ژمارەی نوسراوی داوای پشکنینەکە دەنووسرێت.

٦- نووسراوێك لەگەڵ پێچراوەکە دەنێردرێت، کە پوختەی بارودۆخی ڕووداوەکەو و جۆری پشکنینی داواکراوی تێدایە، لەگەڵ پۆلیسێك یان بە پۆستەی تۆمارکراو دەنێردرێت، بەپێی نزیکی یان دووریی بۆ نێردراو لە تاقیگە پسپۆڕەکان.

**٤- کۆمەڵەی چوارەم : نۆرینی شوێنی ڕووداو :**

نۆرینی شوێنی ڕودانی تاوانەکە بەشێکی گرنگە لە کارەکانی پزیشکی دادوەری، کە لێکۆڵەر لەڕێی تەلەفۆنەوە، بانگی پزیشك دەکات، تا لەگەڵ دەستەی لێکۆڵینەوە بەشداری بکات، بۆ هەڵێنجانی بیرۆکەیەك لەسەر

کەسایەتی تاوانبار و چۆنیەتی ڕوودانی تاوانەکە، بەپێی ئەو شوێنەوارانەی لە شوێنی ڕووداوەکە دەبینرێن، بۆیە لەسەر لێکۆڵەر پێویستە پارێزگاری شوێنی ڕوداوەکە بکات و نەهێڵێت دەستکاریی بکرێت و، ڕێگە نەدات کەسێك پەیوەندیی بە لێکۆڵینەوە لە ڕووداوەکەوە نەبێت، دەست بە شتەکانی ناوی بدات، یان بیانگۆڕێت، لە کەلوپەل و ناوماڵ، تا کاتی ئامادەبوونی دادوەر و دەستەی ڕاسپێردراو بۆ بەشداریکردن لەگەڵی .

**شێوازی لێکۆڵین:**

١. شوێنی رووداو بەگشتی باس دەکرێ و بەپێی چوار ئاراستەکە دیاریی دەکرێ، هەروەها ئەوانەش کە نزیکین، لە خانوو و شەقام و شوێنی تر، وێنەیەکی هێڵکاری ڕونکردنەوەیی شوێنەکە دەکێشرێت و، کاتێك شوێنەواری پەنجە دەبینرێت، شارەزای پەنجە مۆر بۆ وەرگرتنی پەنجە مۆرەکەی، بەمەرجێك بەر لە گەیشتنی، دەستی لێنەدرێت، نەوەك تێکبچێت.

٢. پشکنینی زۆر ووردی شوێنی تاوانەکە و، گەران بەدوای پەڵەی خوێنی یان مەنەوی، یان هی تر، بەگوێرەی جۆری ڕووداوەکە، رووکارەکەی و شێوازی بڵاوبوونەوەی تۆماردەکرێت، باشتر وایە تۆمارکردنی رووکارەکە بە وێنەگرتن بێت، هەروەها بەدوای مادەی نامۆدا دەگەڕێت، وەك پرچ و پەت وپاشماوەی جگەرە و دەنکە شقارتە و چەکی ئاگری یان تیژی و

ئاگر هاوێژەکان و، بارودۆخەکانیان و شوێنی هاتنەژوورەوە و دەرچوونی هاوێژراوە ئاگرییەکان لە دیوار و دەرگاکان و، جۆر و ئاراستەی بڵاوبوونەوەی پارچە شوشەی پەنجەرەکان، بۆ هەڵێنجانی ئەوەی ئەو زەبرە لە دەرەوە بۆ ناوەوە ڕوویداوە یان بە پێچەوانەوە.

تێبینی کردنی دۆخی گشتی شوێنەکە، بۆ ئەوەی بزانرێت دەستکاری کراوە یان تێکدراوە یان شکێنراوە، هەروەها گەڕان بەدوای شوێنەواری پەنجە و پێیەکان و وێنەگرتنیان لەلایەن کەسی شارەزاوە، لە ڕووداوی ژەهراوی بوونیشدا، گەڕان بەدوایی پاشماوەی خۆراکی و شوێنەواری ڕشانەوە و پیسایی پێویستە، هەروەها گەڕان بەدوای ماددەی دەرمانی - کیمیاوی- ، و بوتڵی ماددە چارەسەرییەکان، بەبێ گرنگیدان بەو کاغەزەی پێوەی نوسێنراوە، کە نووسینەکانی سەری ئاماژە بەوە دەدەن کە دەرمانەکە مادەی ئاساییە، لەو جۆرانەی زۆربەمان بەکاری دەهێنین، وەك بۆنموونە ئەسپرین یان گیراوەی یۆریك، کە دەشێ ژەهری لەناودابێ و، دەفرەکە بە مەبەست لەلایەن ئەنجامدەری تاوانەکەوە گۆڕدرابێ، یان بە نەزانی لەلایەن کەسیکەوە، کە مەبەستی دەستدرێژی نەبووە.

٣. لە کاتی بوونی تەرم، یەکەیەکەی جل وبەرگەکانی سەری باس دەکرێت و تەنە نامۆکانی کەپێوەی نووساوە تۆمار دەکرێت، لە ماددەی خۆڵی یان قەوزەیی یان پاشماوەی ڕووەکی، هەروەها جل وبەرگەکان دەپشکنرێن بۆ

گەڕان بەدوای شوێنەواری بەرگری، کە ڕوودانــی دەبێتـە هـۆی دڕان یـان پچڕانی دوگمەکان یان خوێناوی بوون.

تێبینی کردنی نیشانەکانی مردن لەسەر تەرمەکە، بە پشت بەستن بە رووکارەکانی، ئەو ماوەیە دەخەملێنیت کە بەسەر مردنەکەدا تێپەربووە، هەروەك گەڕان بەدوای شوێنەواری توندوتیژی پێویستە، لە ڕووشان و شینبوونەوە و برین و، دیاریکردنی ئەو ئامێرەی ئەوەی کردووە.

پاش کۆتایی هێنان لە نۆرین، ڕاپۆرتێك دەنووسرێت، کە پوختەی دیمەنەکانی تیادا بێت و پزیشك ڕای هونەریی خۆی دەربارەی ڕووداوەکە بدات، کە تاوانکارییە یان ڕووداوێکی ئاساییە، یان خۆکوژیە، هەروەها نموونەکانیش تۆمار دەکات، لەگەڵ ئەو ماددانەی پێشنیاری پشکنینی تاقیگەیی بۆ دەکات، لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕایانەی پێشکەشی دەکات، لێکۆڵینەوە بەڕێوەدەچێت، بەم شێوەیە پزیشکی دادوەری هاوکار دەبێت لەگەڵ تاکەکانی تری دەستەی لێکۆڵینەوە و شارەزایانی پسپۆڕ لە پەنجەمۆر یان لە چەکە ئاگرینەکان، لە کۆتاییدا دەرئەنجامەکان دەردەهێنرێت و، پوختەی ئەوانەی شارەزایان بینیویانە تۆمار دەکرێت، کە زۆر یارمەتیدەر دەبێت لە بەدیارخستنی ڕاستیەکان.

**ئامانج لە توێکاری تەرمی مردوو:-**

توێکاری بۆ هەموو حاڵەتەکانی مردنی گومانلێکراو پێویستە بۆ بەدیهێنانی ئەم هۆکارانەی خوارەوە، بەومەرجەی پزیشك بەبیری بێت کە دەبێ پابەند بێت

بەگرتنەبەری ڕێکارە ئوسوڵیەکان لە چۆنیەتی ئەنجامدانی و وەرگرتنی چەند نموونەیەکی ناوهەناو، لێکۆڵەریش لەسەری پێویستە بزانێت کە ناتوانرێ هۆکاری مردن بە پشکنینێکی رووکاری دیاری بکرێت، ئەوە مەترسی زۆری لێ دەکەوێتەوە، کە زیان بە ناوەرۆکی لێکۆڵینەوەکە دەگەیەنێ، هەرچەندە زیانە بەرچاوەکان توندو ئاشکرا بن.

١- زانینی هۆکاری ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ: مەبەست لە یەکەم ئەوەیە کە زیانەکان یان دەرد و نەخۆشیەکان بەتەنها بەس بن بۆ ڕوودانی مردن، وەك خوێن بەربوونی مێشك و مەیینی خوێن لە خوێنبەری ئیکلیلیی دڵ یان ڕووشانی دەماغ یان دڵ یان لە بەشێکی دیکەی هەناو، لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵیان ڕوودەدەن وەك شکان یان خوێنبەربوون، کە وادەکات بەردەوامی ژیان ئەستەم بێت.

بەڵام ناڕاستەوخۆ هەموو تێکدانێك دەگرێتەوە کە لە جەستە ڕوودەدات بەجۆرێك بەتەنها بەس نییە بۆ روودانی مردن، وە مردن لە ئەنجامی بوونی دەرد و نەخۆشیەکەوە ڕوودەدات، کە بەرکەوتوو بەر لە ڕووداوەکە تووشی بووە، یان دواتر تووشی بووە وەك حاڵەتێکی تێکەڵ، ئنجا ڕوشانی خوێنهێنەر لە (کهف تدرن رئوی) یان ڕوشانی جگەری ئاوساوی کەم هێز، بەهۆی نەخۆشییەکی وەك مەلاریا لە ئەنجامی لێدانێك کە زیانی سوکی لێدەکەوێتەوەو، کەسەکە دەمرێت بە دەردی کوزاز یان ژەهراویبوونی خوێن، لە ئەنجامی پیسبوونی بەکتریایی لە برینێکی سادە یان هەوکردنی پەڕەی مێشك(سەحایا) کە لەدوای

شکانی لێك نەبوەوە لە ئێسکی لووت یان ئاوبەنگ(ذات الجنب) یان هەوکردنی (بریتۆن) لە ئەنجامی برینێك کە زیانەکانی تەنها لە دیوارەکەیەتی، ئەوانە چاکترین نمونەن مەبەست لە هۆکاری ناڕاستەوخۆی مردن ڕوون دەکەنەوە.

٢. **دیاریکردنی بەرپرسیاریەتی بکەر** : پزیشك لە بارە تایبەتەکاندا بەڵگەی زانستی پێشکەش دەکات بۆ رۆشنکردنەوەی لێکۆلینەوەکە، ئەوپەڕی گرنگی هەیە، کە بەهۆیەوە دادوەر بەرچاوڕۆشن دەبێت لە کاتی دەرکردنی حوکمی دادگایی و ئەو بەڵگە هونەرییانە یارمەتیی دەدات بۆ تۆمەتبارکردنی تاوانبارەکە یان بێتاوان کردنی یان سووك کردنی حوکمەکە لەسەری، هەروەها پزیشك لە توانایدایە زیانەکانی هەر ئامێرێکی تاوانی دیاری بکات لەکاتێکدا ئامێری جۆراوجۆر بەکارهاتبێت و لەلایەن زیاتر لە کەسێك، هەروەك لەم ڕووداوانەی خوارەوە روون دەبێتەوە :

ڕووداوی یەکەم : لێکۆلەر داوا لە پزیشك دەکات دڵنیابێت لەوەی کوژراو مەی خواردۆتەوە و پلەی سەرخۆشیەکەی دیاریی بکات ئەگەر خواردویەتیەوە و، ئایا هەستی لەدەست داوە، چونکە بکوژ بیانووی بۆ کارەکەی هێناوەتەوە کە بەرگریی لە خۆی کردووە، بەوەی کوژراو هێرشی کردۆتە سەری و لە باری سەرخۆشی توونددا بووە و دەمانچەی بەدەستەوە بووە ویستویەتی بیکوژێت، هیچ ڕێگایەکی تری نەبووە بۆ خۆدەربازکردن لێی، تەنها بە لێدانی گوللـەیەك کە بووە هۆی کوشتنی، ئەنجامدانی پشکنینی کیمیاوی لەسەر نموونەی خوینی مردووەکە ووتەکانی بکوژ دەسەلمێنی یان ڕەتی دەکاتەوە.

ڕووداوی دووەم : کەسێك سەردانی بنکەی پۆلیس دەکات و دان دەنێت بەکوشتنی ژنەکەی پاش گەڕانەوەی لە گەشتێك و بینینی ژنەکەی لە حاڵەتی زینای بینراو(متلبس) لەگەل کەسێکی تردا، لێکۆلەر داوا دەکات بەڵگەیەکی زانستی پێشکەش بکرێت بۆ سەلماندن یان ڕەتکردنەوەی وتەکانی بکەرەکە. دۆزینەوەی مادەی تۆیی لەناو میهبەل یان لەسەر شوێنێکی تر کۆئەندامی زاوزێ، بەباشترین بەڵگە دادەنرێت، کە دەرگای ئومێد لە بکەر دەکاتەوە بۆ نەرم بوون لەگەڵێ یان سووك کردنی حوکم لەسەری .

٣. کەم تەرخەمی لە چارەسەر: پزیشك ڕوونکردنەوە دەداتە لێکۆلەر لە هەموو کەمتەرخەمییەك لە چارەسەری کە بۆی دەردەکەوێت و چەندە پەیوەندیی هەیە بە هۆی مردنەکەوە، لەبەر ئەوە هەندێك لەوڵاتان ناچار بوون یاسایەك دابنێن، بەهۆیەوە ڕێگر بن لەوی پزیشکی دادوەری بەشێوەی تایبەت پیشەکەی ئەنجام بدات، لەبەر پێکەوەنەگونجانی سیفەتی ڕاوێژکاری و چارەسەری، هەروەك ئەوەی لە کۆماری میسری عەرەبیدا پیادە دەکرێت.

٤. شاردنەوەی نیشانەکانی تاوان : هەندێ جار تاوانبار بە زۆر ڕێگا هەوڵ دەدات لێکۆلەر بەهەڵەدا ببات، ماددەیەکی سوتێنەر بە دەموچاویدا دەکات بۆ شێواندنی و نەتوانینی دیاریکردنی ناسنامەی مردووەکە، یان مادەی پترۆل بەسەر جەستەکەدا دەکات پاشان ئاگری تێ بەردەدات و، بە لێکۆلەر دەڵێت سووتانەکە لەناکاو بووە، یان جەستەی کوژراوەکە هەڵدەواسێت بۆ ئەوەی لیکۆلەر وابزانێت کەسەکە خۆی خۆی کوشتوە .

ڕووداوی یەکەم : تەرمی ئافرەتێك بۆ پشکنین نێردرا و لێکۆڵەر لە داواکارییەکەیدا دەڵێت کە هۆی مردنەکە، وەك دەرکەوتووە، لە ئەنجامی کەوتنە ژێر شەمەندەفەر بووە، پشکنین دەریخست کە هۆی مردنەکە لە ئەنجامی بەرکەوتنی گوللـە بووە، ئەو زیانانەی بەهۆی تایەکانی شەمەندەفەرەکە بەسەر تەرمەکە لێی کەوتووە، نازیندوو بووە.

ڕووداوی دووەم : کەسێك هەواڵی گەیاندە بنکەی پۆلیس گوایە ئۆتۆمبێلکی بینیوە لە نزیك شەقامی گشتی ئاگری تێبەربووە، لێکۆڵەر پەیوەندی پێوەکردم بۆ پشکنینی شوێنی ڕووداوەکە لەگەڵ دەستەی لێکۆڵینەوەدا، بۆمان دەرکەوت کە ئاگرەکە زۆربەی ئۆتۆمبیلەکەی سوتاندووەو پەیکەرە ئاسنییەکەی شێواوە و، تەرمی ئافرەتێکیش لە نزیك سووکانی ئۆتۆمبیلەکە بووەتە خەڵووز، پاش توێکاری بۆمان بەدیارکەوت کە ئەو ئافرەتە دوو گوللـەی بەرکەوتووەو پاشان سووتێنراوە، کە هێشتا لە ژیاندا بووە، ئاگرەکە پاش مردنیشی بەردەوام جەستەکەی سووتاندووە.

٥. زیندوویی بەرکەوتن(حيوية الإصابة): بەرکەوتن بە زیندوویی ناو دەبرێت ئەگەر لە جەستەیەکی زیندوو ڕوویدات، بە توێکاریی تەرمەکە دەتوانرێ دیاریی بکرێت کە برینەکە بەزیندوویی بووە یان نا، لە هەمان کاتدا هۆی مردنەکە دەسەلمێنێت، بۆیە ناتوانرێت هەردەم ڕایەکی زانستی ورد بدرێت سەبارەت بەو بابەتە، بە پشتبەستن بە پشکنینی دەرەکی، هەروەك لەمانەی خوارەوە ڕوون دەبێتەوە، ئەوەش بزانین کە هەوکردن لە هەموو قۆناغەکانی یان کارلێکی

سارێژبوون - لە شوێنی داڕوشانەکە قەتماخە دروست بێت یان لە برینێکدا توێژێکی وشك دروست بێت-، یان بینینی شینبوونەوە، بەڵگەی بنبڕن بۆ ئەوەی کە بەرکەوتنەکە بەزیندوویی بووە.

ڕووداوی یەکەم : بانگ کرام بۆ پشکنین لە گەڵ دەستەی لێکۆلینەوە لە شوێنێك، تەرمی کەسێکم تێدا بینی، گوتیان بەقەزاو قەدەر سووتاوە، بۆمان روون بۆوە کە تەرمەکە لە نزیك سۆپایەکی ئاگریی بووە لە ژوورێکی باڵەخانەیەکی میری، ئاگرەکە زۆربەی کەل و پەل و ڕایەخەکانی سوتاندووە، سەرەتا وا گومان برا کە مردووەکە هەندێك داری لەناو سۆپاکە داناوە تا خۆی لەسەرمای سەختی ئەوساتە بپارێزێت -وەرزەکە زستان بوو- ئیتر گڕی گرتووەو سووتاوە، پاشان ناو ژوورەکەشی گرتۆتەوە، لە ئەنجامی وردبوونەوەی ڕووکاری و پشکنینی توێکاری دەرکەوت کە سووتانەکە لە هەندێ ناوچەی دیاریکراوی جەستەکە بەزیندوویی بووە و لە ناوچەکانی تر نازیندوو، وە بۆم دەرکەوت برین و شینبوونەوە لە بۆشایی دەمیدا هەیە، ڕووکارەکەی وادەردەخات کە ماددەیەکی نەرم وەك پارچە قوماشێك، بەزۆر خراوەتە ناو دەمیەوە، هەروەها پشکنین ئەوەی دەرخست کە بەرکەوتنی زیندووی لە سەریدا هەیە بەهۆی زەبری ئامێرێکی شکێنەر وەك تەور، دوای پێشکەشکردنی ئەو زانیاریانە بۆ دادوەری لێکۆلینەوە، کارەکەی بۆ روون بووەوە، پاش کۆششێکی زۆر نادیارییەکانی ڕووداوەکە ئاشکرا بوو، بکەرەکە دەستگیر کراو دانی پێدانا کە پارچە جەمەدانیەکەی خستۆتە ناو دەمی کەسەکە تا نەتوانێت هاواری

یارمەتی بکات، پاشان چەند جارێك بە تەور لە سەری داوە و ئاگری لەسۆپاکە هەڵگیرساندووەو سەری کوژراوەکەی لە ئاگرەکە نزیك خستۆتەوە، پاش ئەوەی پێی وابووە گیانی لەدەست داوە، وادیارە بەرکەوتووەکە لەو کاتەدا لەهۆش خۆی چووە، -نەك وەك ئەوەی بکوژەکە گومانی بردووە-، بەبەڵگەی ئەوەی بینیمان هەندێك سوتانی زیندوو بووەو، نازیندووەکەش دوای مردنی سوتاوە.

ڕوونبووەوە کە کەسێکی بەردەست چووەتە ژوورەکەو ئەرکی ئاسایی خۆی ئەنجام داوەو (جەمەدانیەکە)ی لە دەمی کوژراو دەرهێناوەو هەناسەدانی دەستکردی بۆکردووە، وایزانیووە برادەرەکەی لە ژیاندا ماوە، پاشان پۆلیسی لە ڕووداوەکە ئاگادارکردوەتەوە بێ ئەوەی باسی ئەوە بکات کە سەرەتا کردوویەتی.

٦. ئاراستەی پێکان : لەوانەیە داوا لە پزیشك بکرێت کە ئاراستەی پیکانەکە لە جەستە دیاری بکات، بۆ سوود وەرگرتن لێی لە زانینی ئەوەی کامە دەست ئامێرە بریندارکەرەکەی گرتووە لە حاڵەتی پێکانی خۆکوژی یان تاوانکاری یان هەڵبەستراو-دروستکراو-، یان بۆ دیاریکردنی شوینی تاوانکارەکە، ئایا لە ئاستی بەرزتر یان نزمتری کوژراوەکە بووە، یان پێکانەکە لە پێش یان لە پاش یان لە تەنیشتەوە بووە.

لە پێکانەکانی گوللـەدا پێویستە لەسەر پزیشك پشکنینی وورد بکات بۆ تێکدانە بینراوەکان، کە لەوانەیە گولەکە دوای چوونە ناو جەستەکەوە، کونی دەرچوونی دروست نەکردبێت، وەك ئەوەی لە پشت ملیەوە گوللـەی بەرکەوتبێ

و له دەمیەوە دەرچووبێ، ئەگەر بەرکەوتوو لەوکاتەدا دەمی کردبێتەوە، بێ ئەوەی شوێنەوار لە سەر لێوەکان یان ددانەکان بەجێ بهێلێ، لەوانەیە گوللـەکە بەر ددان کەوتبێت، ئەو زیانانەی دروستی کردووە دەتوانرێت سوودی لێ ببینرێت بۆ دیاری کردنی ڕێڕەوی دەرچوونی گوللـەکە، هەروەك لەوانەیە ڕێڕەوی گوللـەکە بگۆڕێت پاش لە دەست دانی توانای بڕینی شانەکانی جەستە، وەك ئەوەی بچێتە بۆشایی دڵەوەو، پاشان بەهۆی کاریگەری سووڕی خوێن پاڵ بنرێ و لە بۆڕی خوێنبەری سمتی ڕاست یان چەپ یان ڕان جێگیر بێت، بێ ئەوەی ئەو بۆڕیانە تێکبدات، بێ توێکاری تەرمەکە و گەڕان بەدوای ئەو تێکدانانەی گوللـەکە دروستی کردووە و شوێنکەوتنی ریچکەکەی و دیارییکردنی شوێنەکەی، ناتوانرێت ئاراستەکەی بزانرێ .

٧. دیاری کردنی ئامێرە تاوانیەکە : پزیشك دەتوانێ لە زۆر حاڵەتدا، بەپێی سیفەتی زیانەکان و شێوەکانی و فراوانیەکەی و قوڵاییەکەی و ئاراستەکەی، بگات بەو ئەنجامەی کە ئامێرە بڕەڕەکە یەك دەمە یان دوو دەم، یان ئامێرە ڕوشێنەرەکە شێوە لاکێشەیە یان بازنەیە یان شیوەیەکی دیاریکراوی تری هەیە، یان ئەو ئامێرەی گوللـەکەی هاوێشتووە یەك جۆر گوللـەی هەیە وەك تفەنگ و دەمانچە یان زیاتر وەك تفەنگی ڕاو.

لە تواناادا هەیە لە باری تایبەتدا بە دڵنیایی بڕیار بدرێت کە گوللـەکە لە چەکەوە دیاریکراوەوە هاوێژراوە، یان ئەو چەقۆیەی لە لایەن لێکۆلەر دەستی بەسەردا گیراوە هەمان ئەو چەقۆیەیە کە لە پێکانەکە بەکارهاتووە، ئەوەش لە

حاڵەتی بەرکەوتنی دا بە ناوچەیەی ئێسکی و چەقینی بەشێکی لە ئێسکی پێکراوەکە و جیابوونەوەی لە دەمەچەقۆکە بەهۆی شکانیەوە، لەڕێی بەراوردکردنی پارچە شکاوەکە لەگەڵ چەقۆکە .

٨. چۆنیەتی رووداني پێکان : لە زۆربەی لە ڕووداوەکاندا توێکاری یارمەتی پزیشك دەدات سەرچاوەی زیانەکان و میکانزمەکەی بزانێت، یان ئایا لە ئەنجامی تێپەڕینی تایەی ئۆتۆمبێل بۆ نمونە بووە، یان بە بەرکەوتنی کەسەکە بەزەویدا لە ئەنجامی کەوتنە خوارەوەی لە ئۆتۆمبێل یان لەئەنجامی پاڵەپەستۆیەکی توند کەوتۆتە سەر جەستەی، وەك تێپەڕینی تایەی شەمەندەفەر یان ئۆتۆمبێل بەسەر پەلەکانیدا، یان بەرەودواگەڕانەوەی ئۆتۆمبێل، کە بووەتە هۆی گیربوونی لە نێوان پشتی ئۆتۆمبێلەکە و دیوارەکەی پشتی، هەروەها دەتوانین لە رووکاری شکانی کەللـەسەرو بڕبڕەی ملی سەرەوە بگاتە ئەو ئەنجامەی کە زیانەکان لە ئەنجامی لێدانێکی توند بووە، کە بەر سەری کەوتووە، راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ، ئەوەش لە ئەنجامی کەوتنەخوارەوەی کەسەکە لە شوێنکی بەرزەوە، بەجۆرێك هەردوو پێیەکانی بەر زەوی بکەوێت.

٩. خەملاندنی باری تەندروستی : خەملاندنی باری تەندروستی مردوو دەوستێتە سەر ئەوەی پزیشکی تۆێکار لە راپۆرتەکەی پێشکەشی دەکات، کە کۆی بینینە توێکاریەکانی تێدایە لەگەڵ پشکنینە تاقیگەییەکانی پشتی پێ بەستراوەکان، لەبەر ئەوە فەرمانگەی فەرمی و نیمچە فەرمییەکان و کۆمپانیاکانی بیمەش هەندێ جار داوای زانیاریە پزیشکیەکان دەکەن، کە بەر لە دەرکردنی

بڕیاری پێدانی هەر قەرەبوویەکی دارایی بۆ میراتگرانی مردووەکە پشتی پێ دەبەستن، بۆ دڵنیابوون لەوەی مردنەکە لەکاتی ئەنجامدانی ئەو ئەرکەدا ڕوویداوە کە پێی سپێردراوە، وە ئایا هۆی مردنەکە ڕاستەخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە ئەنجامی ئەو کارە بووە، وەك ئەوەی تەزووی کارەبای بەرکەوێت لەکاتی چاککردنەوەی هەندێك تەلی کارەبادا، لەحاڵەتێکدا پزیشك تێبینیی هەر دەرد و نەخۆشییەکی کرد، پێویستە لە سەری پەیوەندییەکەی بە هۆی مردنەکەوە روون بکاتەوە.



# بەشی دووەم
# مردن و نیشانەکانی

مردن : وەستانی ژیانە، ئەوە مردنی جەستەییە، کە ئەندامەکانی جەستە لە کار دەکـەوێت، ناتوانێـت کارەکـانی بـەجێ بهێنێـی، بـەڵام مردنـی ژوورۆچکەکان(حجیرات) بەپێی جیاوازیی سروشتی پێکهاتەکـەی جیـاوازە، ماسولکەکانی کەسی مردوو بەردەوام دەبێت لەسەر کاریگـەربوونی بەتـەزووی کارەبایی بۆ ماوەی ٢٠ - ٣٠ خولـەك، جگـەر هەنـدێ جـار بـەردەوام دەبێـت لەسەر گۆڕینی مادەی (کلایگۆجین) بۆ کلۆکوز بۆ ماوەی دووکاتژمێر یان زیاتر پاش مردن، زیندەوەرە مەنەوییەکان لەشـوێنی پاراسـتنی بـۆ چەنـد کاتژمێرێـك بەزیندوویی دەمێننەوە، گلێنـە بـۆ چەنـد کاتژمێرێـك بەهەنـدێك دەرمـانی وەك ئەترۆبین کاریگەر دەبێت، لە ئەنجامی چەندین تاقیکردنەوە لەسەر دەیەها مردوو بۆم دەرکەوت کاریگەری مادەکە لەسەری نزیکەی پێنج کاتژمێر بووە.

هەندێ لە لێکۆلەرەکان وتویانە کە گلێنـە بـەزۆری بـەردەوام دەبێـت لەسـەر کاردانەوە بۆ ماوەی بیسـت کـاتژمێر پـاش مـردن، پـاش ٥ - ١٠ خوولـەك لـە

دلۆپاندنی گیراوەی ئەترۆبین یان ئەدرینالین بۆ ناو چاو، گلینەکان بەبڕی ١ - ٦ ملم فراوان دەبێ، پاشان پاش نزیکەی دوو کاتژمێر دەگەڕێتەوە بارە بنچینەییەکەی.. باشترین بەڵگە لەسەر ئەوە، سەرکەوتنی نەشتەرگەریی دوورینەوەی شانەییە، کە پزیشکانی نەشتەرگەری(جراح) هەندێك بەشی جەستە وەك بیلبیلەی چاو لە جەستەی مردوو بۆ کەسێکی زیندوو دەگوازنەوە، لەکاتێکدا ئەو دوورینەوەیە بەسەرکەوتوو نابێت تەنها ئەگەر ئەو ژوورۆچکانەی شانەکەی لێ وەرگیراوە زیندوو بێت.

نیشانەکانی مردن : هەندێك گۆڕانکاری لە تەرمەکە ڕوودەدات و بە نیشانەکانی مردن دادەنرێت، گرنگترینیان باسدەکەین:

١- ڕەقبوونی مردن(الصمل الموتی) - ووشکبوونەوەی مردن: لەدوای مردن ماسولکە جەستەییەکان بۆ ماوەیەکی کورت خاو دەبنەوە، پاشان ڕەقبوون بەدەردەکەوێت، کە بریتییە لە گرژبوونی وردەوردە لە ریشاڵەکانی ماسولکە خۆویستەکان و خۆنەویستەکان، لە سەر دەست پێ دەکات تا دەگاتە پێیەکان، پاشان وردەوردە نامێنێ بەهەمان ئەو ڕێزبەندییەی دەستی پێ کرد.

ڕەقبوون لە پێلوی چاوەکان بەدیار دەکەوێت، پاشان بەرەو خوارەوە بڵاو دەبێتەوە بۆ ماسولکەکانی ڕوو، ئنجا مل ، ئنجا سنگ ، ئنجا سك ، لەکۆتاییدا ماسولکەی پەلەکانی سەرەوە ئنجا خوارەوە، ئەوەش هەموو ماسولکە خۆویست و خۆنەویستەکان دەگرێتەوە، بە دیار و نادیارەوە، دەرچەی گلێنە ئەگەر فراوان بوو تەسك دەبێتەوە، قەبارەی دڵ بچووك دەردەکەوێت و بەو هۆیەوە

ماسولکەی دیوارەکانی هەڵدەئاوسێت، ئەوەش لەوانەیە پزیشکی پشکنەر بخاتە هەڵەوە و وابزانێت ئەو تەسك بوونەوەو هەڵاوسانە بەهۆی نەخۆشیەوەیە.

ماسولکە ڕاگرەکانی موو گرژ دەبنەوەو رووی پیست دەبێتە دەبێتە خاڵخاڵ و سیکلۆچکەکانی مەنی گرژ دەبنەوە و ئەو شلەی تۆییەی تیایەتی دەری دەدات و شوێنەوارەکانی لەسەری ئەندامی نێرینە یان لەسەر ڕانەکان دەبینرێت لە هەندێ حاڵەتدا، ئەم ڕووکارە لەوانەیە سەر لە لێکۆڵەر بشێوێنێ ئەگەر وا گومان ببات کە پەیوەندی بەکردەی سێکسیەوە هەیە.

## گرنگیەکەی :

١- خەملاندنی کاتی مردنەکە: ڕەقبوون پاش نزیکەی ١ - ٣ کاتژمێر دەست پێدەکات و لەوانەشە زووتر، پاش ٨ - ١٢ کاتژمێر هەموو جەستە دەگرێتەوە، پاشان دوای ٢٤ کاتژمێر لە وەرزە گەرمەکان و، دوای تێپەڕبوونی ٣٦ - ٤٨ کاتژمێر لە وەرزە مامناوەندەکاندا و، دوای تێپەڕبوونی ٧٢ کاتژمێر یان زیاتر لە وەرزە ساردەکاندا نامێنێت، لەوانەیە هەندێ جار رەقبوون لە پەلەکانی خوارەوە ببینین دوای تێپەربوونی ٣ - ٥ رۆژ لە مردن.

٢- زانینی باری تەرمەکە: دەمی داخراو بە بەستەرێك و دەستی هەڵواسراو بۆ سەرەوە یان بۆ دواوە، لەسەر هەمان بار دەمێنێتەوە، بە کاریگەری رەقبوونەکە، هەتا دوای کردنەوەی بەستەرەکەش، بەو پێیە لەهەمان کاتدا دەکرێ رووکارە بینراوەکە بکرێتە بەڵگەی بەکارهێنرانی بەستەر.

**لەو رووکارانەی لێکچووی ڕەقبوولی مردوون :**

**مەیینی پرۆتینی ماسولکەیی:** گەرمی بەرز وەك لە حاڵەتەکانی رووداوی سووتان دەبێتە هۆی مەیینی خێرای پرۆتینی ماسولکەکانی جەستەو گرژدەبێتەوەو ڕەق نابێت، بەڵکو وەك خۆی دەمێنیتەوە هەتا بە کاریگەری شیبوونەوە خاو دەبێتەوە. مەیینی پرۆتین کە لە جەستە بەشێوەیەکی نارێك لەرووی پلەوە ڕوودەدات، دەبێتە هۆی کورتبوونەوەی کۆمەڵێك ماسولکە و کۆمەڵێکی تر نا، وەك ماسولکەی پەلەکان بەنموونە، جومگەکانی دەچەمێنەوەو کەسی سووتاو شێوەی یاریکەری بۆکسێن یان زۆرانباز وەردەگرێ، لەوانەیە چوونەوەیەك ئەوەندە توندبێ کە ببێتە هۆی پچرانی ریشاڵە ماسولکەییەکان، لەسەر پزیشك پێویستە شوێنی پچرانەکە بەوردی بپشکنێ بۆ دڵنیابوون لەوەی کە زیندەکییە یان نازیندەکی.

**بەستنی(انجماد) شلەکانی تەرمەکە:** هەرچەندە پلەی گەرمی دابەزێ دەرکەوتنی رەقبوون دوا دەکەوێت و لە پلەی سفری سەدی و خوارتردا بەتەواوی دەوەستێت، لەو کاتەدا شلەکانی تەرمەکە دەیبەستێت و جومگەکانی ووشك دەبێتەوە، هەرچەند گەرمی بەوشێوەیە بێت، ئەگەر دەوروبەرەکە گۆڕا و تەرمەکە دەرهێنرا بۆ کەشێکی ئاسایی، شلەکان دەگەڕێنەوە باری یەکەمی، پاشان ڕەقبوون دەست پێ دەکا بەو شێوازەی باسکرا.

**گرژبوونی (شڵەژانی) مردن:** گرژبوونی ماسولکەیی زیندووە، پێش مردن ڕوودەدات و ڕووکارەکانی بەردەوام دەبێت لەکاتی ڕوودانی دەبینرێت بێ ئەوەی خاوبوونەوەی سەرەتایی دەرکەوێت.

گرژبوون لەو ڕووداوانەی مردن ڕوو دەدات کە پشێویی دەماریی توند و کۆششێکی مێشکی لەگەڵدایە، لای ئەوانە دەردەکەوێ کە خۆیان دەکوژن یان لە جەنگدان یان نقوم بوون یان شوێنە دەمارییەکانی بەسەختی بریندار بوون.

باری گرژبوونی مردن بریتییە لە بەردەوامیی باری ئەو خۆگوشینەی لە کاتی ژیانـدا ڕوویـداوە، کەسـی خۆکـوژ هـەر ئـەو تفەنگـەی گرتـووە کـە بـۆ خۆکوشـتنەکەی بـەکاری هێنـاوە، سـەربازی مـردووی پێکـراو لەسـەری لـە سەنگەرەکەی هەر لە باری گرتنی چەکەکەی و ئامادەییدایە بۆ هێرش کردن .

لەوانەیە ئەوە بە مێشکدا بێت کە دەکرێت گرژبوونەوەی مردن پیشان بدرێت بەدانانی چەك لە دەستی کوژراو هەتا ماسولکەکانی بەکاریگەری ڕەقبوون دێنەوە یەك و چەکەکە دەگرێت، بەو شێوەیە بکوژ دەتوانێ تاوانەکەی بشارێتەوە بەبەڵگەی ڕوودانی خۆکوژی، بەڵام لەڕووی زانستیەوە ئەنجامدانی ئەوە نزیکە لە مەحاڵ، چونکە دەکرێ بە توندیی هاتنەوەیەکە ماسولکەییەکە گرژوون بە ڕەقبوون جیا بکرێتەوە.

**گرنگیەکەی :** گرژبوونی مردن بۆ لێکۆڵینەوە دیاردەیەکی گرنگە، کە دەبێتە بەڵگەی باری خۆکوژییەکە .

**٢- پەڵەکانی مردنی – داچۆڕانی خوێنی** : بریتییە لە پەڵەی خوێنین، لە بەشەکانی خوارەوەی تەرم بەدیاردەکەوێ بەپێی بارەکەی، لەئەنجامی خاوبوونەوەی سەرەتایی و پڕبوونی دەمارەکانی خوێن بەو خوێنەی بەرەو خوارەوە داچۆڕاوە، سەرباری هۆکاری کێشکردن و ملکەچ بوونی شلەی خوێن بۆ یاسای هاوسەنگی شلەکان، پاش وەستانی دڵ و نەبوونی پاڵەپەستۆی خوێن.

ڕەنگ بوون لە پێست و لە ناوەوەی تەرمەکە بەشێوەی پەڵە دیاردەکەوێ و زۆر نابات فراوان دەبێت و ڕوونتر دەبێت، هەندێکیان لێکدەدەن و پەڵەیەکی گەورە پێك دێنن، دەکەونە رووی خوارەوەی جەستە، بێجگە لە شوێنە توندکراوەکان بە کاریگەریی جەستە وەك پشتەسەر و شانەکان و سمتەکان و پاژنەکان، ئەگەر تەرمەکە لە سەر پشت بوو، هەروەك لە لێوارەکان دەرناکەوێ، واتە لەو شوێنانەی دەکەونە بەرامبەر بەستەرە جۆراوجۆرەکان (ستیان – پشتبەست، پشتێن، دۆخین ... هەتا دوایی).

پەڵەکانی مردن هەندێ جار بەشێوەیەك دەردەکەون کە ناوچەکان چوونە ناوەیەك یان لەیەکتر نزیك بەدوو ڕەنگی سووری کاڵ و یەکێکی تر تۆخ یان نزیکە شین، هەندێ لە لێکۆڵەران ئەم دیاردەیە دەگەڕێننەوە بۆ بوونی ڕێژەی جیاواز لە هیمۆگلۆبینی ئۆکسێنراو و خەپلە هیمۆگلۆبین، هەندێکی تر دەیگەڕێننەوە بۆ ئۆکسانی بەشێك لە خوێنی تەرمەکە بەو ئۆکسجینەی لەپێستەوە بۆی دەچێت، من بۆخۆم تێبینی ئەوەم کردووە لە بەشە دیارەکەی ئەو تەرمانەی

لە ساردکەرەوەی پـەیمانگای پزیشـکی دادوەری لـە بەغـدا بـۆ چەنـد رۆژێـك پارێزرابوون، لەلایەکی ترەوە لـە حاڵەتـەکانی مـردن بەسـەرما ئـەوە دەبینرێـت، تووشبوونەکە – بەگوێرەی توونـدی سـاردییەکە - دەبێتـە هـۆی دواکـەوتن یـان وەستانی هەڵوەشاندنەوەی هیمۆگلـۆبینی ئۆکسـێنراو، لەکاتێکـدا ئـەو ژینگەیـە کەمتر کاریگەریی لەسەر توانای ئۆکسانی خوێن دەبێت.

## گرنگیەکەی :

١- کاتی روودانی مردنەکە : پاش مردن بەکاتژمیرێك تا سێ کـاتژمێر پەڵـەکان دەست بە دەرکەوتن دەکـەن، پـاش ٨ - ١٢ کـاتژمێر دەگاتـە ئەوپـەڕی ڕوون و ئاشکرایی. هەتا خوێنەکە شل بێت، شوێنی پەڵـەکان بـەگۆڕانی بـاری تەرمەکـە دەگۆڕێت، پاش چەند کاتژمێرێك ئەگەر خوێنەکە مەیی، ئەوا پەڵەکان لە شـوێن خۆیان جێگیـر دەبـن، لـەکاتی ئاسـاییدا پـاش مـاوەی ٤ - ٨ کـاتژمێر خـوێن دەمەیێت.

٢- باری تەرمەکە : لـە تـەرمی خنکێـنراودا پەڵـەکان لـە خـوار سـەر و لـە روومەتەکان وە خوارەوەی پەلەکان و، بەڕوونی لە نینۆکەکان دەرکەوێت، وە لەو تەرمەی لەسـەر پشـت کـەوتووە، پەڵـەکان لـەڕووی پشـتەوەی جەسـتە بـەدیار دەکەوێ، بێجگە لەو شوێنانەی لەسەری وەستاوە، لـە نـاوەوەش لـە پشـتەوەی مێشك و سیەکان و جگەر و گەدە و ریخۆڵـەکان و هەنـاوی هـەردوو بۆشـایی سینگ و سك دەردەکەوێت، بەڵام پێشەوەی ئەو هەناوانە کاڵ دەبن .

٣- پێکهاتنی بیرۆکە لەبارەی هۆکاری مردن : پەیدابوونی پەڵە سووری گەش لە رووداوەکانی خنکان بە یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن و، سووری تاریك لە حاڵەتەکانی دیکەی خنکان و، رەنگی قاوەیی لە رووداوی ژەهراوی بوون بەکلۆراتی پۆتاسیۆم. پەڵەی کەم روون لە رووداوی مردن لە ئەنجامی خوێنبەربوون یان کەم خوێنی، یان پاش مردن بەو نەخۆشیانەی دەبنە هۆی مەینی خێرای خوێن، پەڵەی زۆر ڕوون و ئاشکرا لە حاڵەتەکانی خنکان و تووشبووان بە زیادبوونی خوێن.

٤- بەڵگەدانەوە لەسەر بوونی پەتی بەستن : بەدیاردەکەوێ شوێنی پەستانی بەستن بەسووکی وە بەدیارکەوتنەکەی جیاواز دەبێ بەگوێرەی توندی بەستانەکە، وە دەتوانین بەڵگەدانەوە بەبوونی قۆرتایی لەسەر بەدەست هێنانی بەستانەکە وە هەروەها دەتوانین جۆری بەستانەکە جیابکەیتەوە لە رووخساری قۆرتاییەکەی ، پشکێنەر دەتوانێ لەسەرباری ئەوەی باسمان کرد لە هەڵنجانی را لەباری کۆمەڵایەتی بۆ مردووەکە ، ئەگەر بتوانین بەوەی بزانێ بەوەی کە کاتژمێری دەستی بەکارهێناوە بەقایشی پێستەیی یان کانزایی یان کاتێ پشتێنی بەستایی یان گۆرەوەی لەبەرکردبێ یان کە ئافرەتێك پێستێکی بەکار هێنانی پارچە قوماشێکی لە لاقەکان و پیتەکانی لوول درابێ وەك ئەوەی لە خێلەکیەکانی لای خۆمان .

٣- هەلوەشانەوە : مردووی بۆگەن – لێك جیابوونەوەی بەهەنگاو لە چنراوی تەرمەکە بەهۆی میکرۆبەکانی بەردەوام دەبێ هەتا رووخساری نامێنی

